## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

بێگوومان قورئان ئارامی و سەکینەت بە هاوەڵەکەی دەبەخشێ وە هاوەڵەکەشی کەسی خوێنەر و بیسەر و کارپێکەر و لەبەرکار فێرکاری قورئان دەگرێتەوە، وە ئەگەر هەموو ئەو سیفاتانە لە کەسێکدا کۆبوونەوە ئەوە نور علی نور، لێرەدا نامانەوێ ئاماژە بە فەزڵ و گەورەیی هاوەڵییەتی قورئان بکەین بەڵکو لەسەر (لەبەرکردن) قسە دەکەین و لەویشدا باسی چۆنیەتییەکەی دەکەین بزانین چ شتێک دەبێتە ڕێخۆشکەر بۆ لەبەرکردنی قورئان و لەبیرنەچوونەوە و لێ تێک نەچوونی.

ئاسان لەبەرکردنی قورئان و لەبیرنەچوونەوە و لێ تێک نەچوونی بۆ زانینی چەند خاڵێک دەگەڕێنینەوە:

1- زانینی خوێندنەوەی قورئان

2- زانینی تەجوید

3- زانینی مانای ئایەتەکان

4- زانینی یاساکانی عەرەبی (قواعد)



## خاڵی یەکەم

ئەمەیان پێش لەبەرکردنیشە چونکە ئەوەی قورئان لەبەربکا بە تەئکید دەبێ خوێندنەوەی ڕەوان بێ و شارەزای ٢٩ پیتەکەی زمانی عەرەبی بێ و بزانێ وەکو خۆی بیانخوێنێتەوە، وە جگە لەمەش دەبێ بزانێ فەتحە و کەسرە و ضەمە و سکون و شەددە خوێندنەوەکەیان چۆنە.

## خاڵی دووەم

ئەمەشیان وەکو خاڵی یەکەم ئەوەی قورئان لەبەربکا دەبێ لانیکەم شارەزای هەندێک لە یاساکانی تەجوید بێ، **وەکو:** حوکمەکانی نونی سکوندار و تەنوین، حوکمەکانی میمی سکوندار، مەخرەجی پیتەکان، قەلقەلە، هەمس، نیشانەکانی وەستان و دەستپێکردن، هەندێکی دیکەش.

## خاڵی سێیەم

ئەمەیان زۆر ئاسانکاری دەکا بۆ لەبەرکردن چونکە ئەگەر مانای ئەو ئایەتەت زانی دەتەوێ لەبەری بکەی دەتوانی بە کاتێکی کەمتر لەبەری بکەی و درەنگتریش لەبیرت دەچێتەوە.

## خاڵی چوارەم

ئەوەیان وەکو خاڵەکانی سەرەتا نییە واتا لەبەرکاری قورئان لەسەری پێویست نییە قەواعیدی عەرەبی بزانێ بەڵام ئەگەر بیزانێ لەبەرکردن و لەبیرنەچوونەوەی زۆر بۆ ئاسان دەکات

القرآن الكريم

وشەی (الحوت) واتا نەهەنگ لە قورئاندا سێ جار دووبارە بۆتەوە، لە ئایەتەکانی [ الكهف : ٦٣ ] و [ الصافات : ١٤٢ ] و [ القلم : ٤٨ ]، جارێک پیتی (ت)ەکە فەتحەی هەیە، جارێک ضەمەی هەیە، جارەکەی دیکەش کەسرەی هەیــە. بــۆ لێکجیاکردنەوەیان و بۆ زانینی ئەوەی کە کامیان فەتحەی هەیە و کامیان ضەمەی هەیە و کامەشیان کەسرەی هەیە دەتوانین سوود لە قەواعیدی عەرەبی ببینین، بەوەی کە: هەموو بکەر (فاعل)ێک مەرفوعە، وشەیەک کە مەرفوع بێ زۆربەی جار پیتەکەی ئاخیری ضەمە دەبێ، (فَإِنِّي نَسِيتُ ٱلْحُوتَ) [ الكهف : ٦٣ ]، واتا: جا بەڕاستی من (لەوێ) ماسیەکەم لەبیر چوو، لێرەدا (إنّي) جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی یەکەمی تاک دەبێتە بکەر، وە (تُ)ش کە جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی تاک ئەمیش هەر بکەرە، و کارەکەشمان (نسيتُ)ە، بەرکار دەمێنێتەوە ئەویش (الحوتَ)ە، بۆیە هەرجارێک کە بێلەبەر ئەو ئایەتەت خوێندەوە مەحاڵە ئەو فەتحەیە بگۆڕی بە ضەمە یاخود کەسرە. ئەمە پێشەکییەک بوو بۆ ئەوەی بزانین سوودی قەواعیدی عەرەبی چییە بۆ لەبەرکردن و لەبیرنەچوونەوە و لێ تێک نەچوونی قورئان.

# فاعل:

واتا بکەر لە حاڵەتی ئیعرابیدا هەمیشە مەرفوعە، بۆ نموونە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: (ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ) [ الروم :٤٠ ] واتا اللّه ئەو زاتەیە کە ئێوەی درووست کردووە، لێرەدا بکەر (فاعل) دیارە کە (الله)یە و ضەمەی وەرگرتووە، بەڵام هەمیشە کۆتایی وشەکە نابێتە ضەمە یان تەنوین ضەمە، بۆ نموونە ئەگەر فاعل ئەداتی ناصیبەی لە پێشەوە هات حەرەکەی پیتی کۆتایی نابێتە ضەمە وەکو (إنّ اللهَ فالق الحبّ والنوى)، لێرەدا (الله) (فاعل)ە بەڵام ضەمەی وەرنەگرتووە. بۆ نموونە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: (أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ) [ البقرة : ٥ ]، لێرەدا وشەی (أُوْلَٰٓئِكَ) بۆتە بکەر بەڵام ضەمەی وەرنەگرتووە، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە بووبێتە مەنصوب، نا، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئەو وشەیە هەرگیز گۆڕانکاری بەسەر حەرەکەی پیتی کۆتایی وشەکەدا نایەت، چەندین وشەی دیکەش هەن بە هەمان شێوەن.

# مفعول به:

واتا بەرکار، لە حاڵەتی ئیعرابیدا هەمیشە مەنصوبە، حەرەکەی پیتی کۆتایی وشەکە فەتحە یان تەنوین فەتحە وەردەگرێ بە مەرجێک حەرف جەڕی لە پێشەوە نەهاتبێ، ئەگەر مفعول بە حەرف جەڕی لە پێش بوو دەبێتە إسم مجرور، نموونەیەک بۆ بەرکار دەهێنینەوە، (إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ) [ الحجر :٩ ] لێرەدا بکەرەکە (إِنَّا و نَحۡنُ) بکەرن، هەردووکیان جێناون، (نَزَّلۡنَا) کاری ڕابردووە، (ٱلذِّكۡرَ)یش دەبێتە بەرکار، لێرەدا مەبەستمان بەرکارەکەیە کە لەبەر ئەوەی بەرکارە پیتی کۆتایی وشەکە فەتحەی وەرگرتووە، ئەی بۆ تەنوین فەتحەی وەرنەگرت؟ لەبەر ئەوەی ئەلیف و لامی پێوەیە، لێرەشدا یاسایەکی دیکەی زمانی عەرەبی سوودی بۆمان دەبێ ئەویش ئەوەیە کە (هەرگیز هیچ وشەیەکی عەرەبی کە ئەلیف و لامی هەبێ تەنوین وەرناگرێ) بە پێچەوانەشەوە ڕاستە، (هەر وشەیەک تەنوینی هەبێ ئەلیف و لام وەرناگرێ). با نموونەیەکی دیکە بێنینەوە هەر لەسەر (مفعول بە) هەر وشەی (ذِكۡرَ) بەکاردێنین، خوای میهرەبان دەفەرمووێت: (ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرًا كَثِيرًا) [ الأحزاب : ٤١ ] واتا: زۆر زۆر یادی خوا بکەن، لێرەدا (ذكرا) (مفعول بە)ـە و مەنصوبە، بۆیەش تەنوین فەتحەی وەرگرتووە.

# إسم مجرور:

ناوێکە بە هۆی حەرف جەڕی پێش خۆیەوە بۆتە مجرور، زۆربەی جار کەسرە یان تەنوین کەسرەی هەیە، بەڵام لە هەندێک جاردا ناگوونجێ کەسرە یان تەنوین کەسرەی هەبێ، بۆ نموونە هەندێک شوێندا وشەی (یوسف، فرعون) هاتووە و لە حاڵەتی مەجروردایە بەڵام کەسرەش وەرناگرێ، بەڵام لێرەدا باسی حاڵەتە ئاساییەکە دەکەین، پەروەردگار دەفەرمووێت: (مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا ٱسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ) [ الأنبياء : ٢ ]، واتا: هەر پەیامێکی تازەیان لە پەروەردگاریانەوە بۆ بێت (کە قورئانە) ئەوان دەیبیستن و گاڵتەی پێ دەکەن.

وشەی (ذكر) حاڵەتە ئیعرابییەکەی بۆتە مجرور بە هۆی ئەوەی حەرف جەڕێکی لــە پــێــشــەوە هاتووە، لێرەشدا تەنوین کەسرەی وەرگرتووە، ئەگەر وشە مەجرورەکە ئەلیف و لامی پێوەبوو ئەوا تەنیا کەسرە وەردەگرێ. هــەنــدێک لــــــە حەرف جەڕەکان: (مِن، على، عَن، إلى، في، بِ، لِـ ... هتد).

---

لَن: مانایەکی دیاریکراوی نییە، بەڵام کە بەکارهات واتا فیعلەکەی دوای خۆی هەرگیز ڕوونادات، ئەداتی ناصیبەیە، واتا چۆن حەرف جەڕ ناوی دوای خۆی دەکاتە مەجرور، ئاواش لَن ناوی دوای خۆی دەکاتە مەنصوب، بەڵام زۆربەی جار ناوی بە دوادا نایەت، بەڵکو کاری بە دوادا دێ، بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرمووێت: (فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِىٓ أَبِىٓ) [ یوسف : ٨٠ ]، واتا: کەواتە من ئەم زەویە بەجێ نایەڵم هەتا باوکم مۆڵەت (ی گەڕانەوە)م پێ نەدات. تێبینی/ ئەمە ئایەتە، خوای گەورە لەسەر زاری یەکێک لە براکانی یوسف وای فەرمووە، واتا براکەی یوسف وای گووتووە و خوای گەورەش قسەکەی ئەوی باس کردووە لە قورئاندا. دوای لَن کاری بەجێهێشتن هاتووە، بەوەدا دەزانین کە هەرگیز ئەو بەجێهێشتنە ڕوونادات، ئەوە برایەکی یوسف بوو لە میصرٍ کە زانی برایەکی دیکەی دزی کردووە گووتی ناڕۆمەوە کەنعانێ هەتا بابم ئیزنم نەدا یان خوای گەورە بڕیارێکم بۆ نەدا.

لَم: ئەویش هەمان شتە لەگەڵ لَن، بەڵام لَن بۆ داهاتووە لَم بۆ ڕابردووە، واتا کە لَم بەکارهات لەگەڵ کارێک دیارە کە کارەکە هەرگیز ڕووی نەداوە، بۆ نموونە خوای بەدەسەڵات دەفەرمووێت: (لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ) [ الإخلاص : ٣ ]، واتا: کەسی لێ نەبووەو لەکەس نەبووە. دووجار لَم هاتووە هەردووک جارەکە واتا هەرگیز ئەو کارە ڕووینەداوە.



بـەڕێزان دیـارە کە زۆر بابەت هەن کـە بـە زانیـنـیـان وادەکات کە قـورئـانـی پـیـرۆز زووتـر لەبەربـکـەی و درەنگتریش لەبیرت بچێتەوە بەڵام ئێمە لێرەدا هەندێک زانیاریمان تێدا نووسیون کە ئاسانن بەڵام گرنگـن بــۆ لەبەرکاری قورئان، هــەم بـۆ زوو لەبـەرکردن هەمـیش بـۆ زانینی مانا، نەمانویستووە درێژەی بدەینێ هەر بە پـووختی بـاسمان کردووە ئەگەر کەسێک نیازی قورئان لەبەرکردنی هەبێ پێمـان وایە کە ئـەوانـەی باسمـان کردووە سـوودی بـۆی دەبـێ، ماوەتەوە ئەوەی کـە بڵێین خوای گەورە لە ئێمەی قبووڵ بکا و یارمەتی هەر کەسێک بدا کە بە تەمای لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزە ئێمە خۆشحاڵ دەبین ببینە ڕێنیشاندەری کـەسێک کە بیەوێ قورئان لەبەر بکات، هەر شـتێکی باشـی ئـێرە بەخششی خوای گەورەیە و داوای لێبووردن و گەردن ئازاییتان لێدەکەین بۆ هەر کەم و کورتییەک کە خۆمان لێی بەرپرسیارین جا بە نەزانین بمانکردبێ یان نا.

سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ
وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ
وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ

